# چەند وشەیەک بۆ ڕەنگی خۆڵ

نووسینی
ئێدیت هێنری

لم
هەزاران گەردیلەی وورد کە با دەیانبا
چەشنی ئەو ڕۆحانەی بە پەنهانی دامرکانەوە

بێپایانیی مەرزی ڕەنگەکان
نارنجی، زەرد یا سوور
لە خۆڵەمێشی یا سپیواژییەوە بۆ ڕەش
ئینجا سوورێکی گەش
تەقینەوە

تەقینەوەیەکی خوێناوی لە 1 ی شوباتی 2004
مردوو...
دیسان ... زۆر مردن
زۆر بریندار بوون
کێ دەڵێ هاوڕێکانمان لە نێوان ئەواندا نەبوون؟
لەوێ، لە هەولێر ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژن بوو

لەم ڕۆژەوە
ژنێک و پیاوێک
دوو مرۆڤی کورد دوور لەو شارەی کە خۆشیان دەوێ
دوو هاوڕێی دوور لە یەکتر
نەزەند بەگیخانی و دلاوەر قەرەداغی
بۆ ماوەی چەندەها مانگ
لە ئیمەیلێکەوە بۆ ئیمەیلێکی دیکە
لە نێوان سوید و فەڕەنسا/بەریتانیادا
هۆنراوەیەکی درێژیان چنی
ڕۆحی ئەو شارە دووبارە کوژراوە لە ناخیاندا هەڵچوو
بوو بە حەیرانێکی باڵا
حەیرانی ڕەنگی خۆڵ

نەزەند و دلاوەر حەزیان کرد دوو کەسی دیکەش، ژن و پیاوێک، سەدایەکی وێنەئامێز بە شیعرەکەیان ببەخشن. بۆ ئەو مەبەستە، ئەوان هونەرمەندی کورد قەرەنی جەمیل – یان هەڵبژارد کە خەڵکی شاری هەولێرە... لەگەڵ من!
کاتێک نەزەند داوای لێکردم بچمە ناو ئەو حەیرانەوە، ببمە بەشێک لەو هاوارە، خۆم بە شەرەفمەند زانی و زۆر کاری تێکردم. هەر لە خودی خۆمەوە و لە یەکەم سات حەزم دەکرد بڵێم بەڵێ.

داهێنانی بەکۆمەڵ و تێکەڵیی هونەر و لم دوو رەهەندی گرنگی کاری هونەری منن. هەولێریش یەکەم شاری کوردی بوو کە من ناسیم. بەڵام ئایا ئەمانە دەبنە مایەی ئەوەی کە من ببم بە یەکێک لە داهێنەرانی رەنگی خۆڵ، من کە کورد نیم ؟ ئایا من جێگام دەبێتەوە لە تەک ئەو سێ هونەرمەندە سەمیمییە؟ من لە سەر ئەو زەمینە شاخاوییە گەورە نەبووم کە لەم بیست-سێ ساڵەی رابردوو زۆر مەینەتی بینیوە، لەسەر ئەو زەمینەی کە سەدای دەفی لێ هەڵدەستێ، کە گەردی لمی لێدەفڕێ.. ئایا من دەتوانم سەدایەکی حەساسی شیاو ببەخشم بەو شیعرە کە لێوانلێوە لە بەتینترین هەست و سۆزی داهێنەرەکانی، لە پەنهانیترین مێژوویان، بە زمانێک کە من تەنها چەند ووشەیەکی لێ تێدەگەم؟

لە پشت وەڵامم بۆ ئەو داواکارییە و هەروەها حەزی خۆم بۆ بەشداریکردن لە لە کارێکی بەکۆمەڵ لەگەڵ چەند هونەرمەندێک لەودیوی ئاسۆکان: نەزەند بەگیخانی کە دەیەها ساڵە دەیناسم و لەسەر ئاستی هونەری و هەروەها ئاستی پرۆفێشنالی و هاورێیەتیشدا بەهای زۆرە لەلام، قەرەنی جەمیل کە لە ئەیلولی 2004 و لە هەولێر ناسیم، لەگەڵ دلاوەر قەرەداغی کە لە نیسانی 2005 لە سوید بە دیداری شاد بووم، من پێویستم بەوە بوو هەست بکەم بەوەی کە دەتوانم شتێک بەو بەرهەمە ببەخشم. لە سوید لە ئاووهەوایەکی تێکەڵ بە مۆسیقای کوردی و سەما و دەنگی پێکەنین و گفتوگۆی گەرم، گوێم لە دلاوەر و نەزەند گرت پێکەوە شیعرەکەیان خوێندەوە.

پێشتر نەزەند بە کورتی و بە چەند دێرێک ناوەرۆکی شیعرەکەی بەم جۆرە بۆ وەسف کردبووم...«لە کێشانی وێنەکان بیر لە دایکم بکەرەوە، لە ئەنفال، لە هەڵەبجە، لە پانتایی تراژیدیا، مەرگ، تەنهایی، وێرانبوون. بەڵام هەروەکو وتم، لە سەرانسەری شیعرەکە ئەتمۆسفیرێکی رۆحیی هەیە کە بەند نیە بە ئایینێکی تایبەتیەوە. ئەو رۆحانییەتە سۆفیگەرییە لە کۆتاییدا دەبێتە مایەی رزگاربوون. لە سەرانسەری شیعرەکەدا فیگەرێکی سۆفیی هەیە کە ناوی دووبارە دەبێتەوە وەکو سیمبۆلی رزگاربوون، سیمبۆلی هیوا و هەروەها سیمبۆلی ئازار... بەڵێ ئازار حزووری زۆرە لە شیعرەکە، بەڵام تەنها ئازاری خوێناوی نا ...»

به بێ ئەوەی بزانم شیعرەکە بیخوێنمەوە و بە ئاشنایەتیم لەگەڵ چەند وشەیەکی کەم، سەیریم کرد و لێی رامام، بە رێنووسێکی جوان و ئەلفوبێی عەرەبی (بەڵام جیاواز) دارێژرا بوو، بەمجۆرە ئاڵودەی بووم. بە بێ ئەوەی لە زمانەکە بگەم، لە راستیدا من زۆر کەم لە کوردی دەگەم، بۆیە گوێم لە رەنگی خۆڵ گرت. مۆسیقاکەی زۆر بەگوڕ لە ناخمدا دەنگی دەدایەوە. چێژم لە مۆسیقاکەی وەرگرت و ناوەڕۆکەکەیم لە خەیاڵدا وێنە کرد. دواتر هاوڕێی کوردم «شکور بایز» شیعرەکەی وەرگێڕایە سەر زمانی فەڕەنسی.

(دەمێکی تر مۆسیقا دەبیستم)، ئەمە ناونیشانی یەکێ لە نمایشەکانی من و بێرتراند فۆلی – یە. لەو نمایشەدا من بە لم وێنەی ئەو چیرۆکانە دەکێشم کە پەیوەستن بە مردن، بە پەیوەندیی نێوان مردوو و زیندوو...

من کورد نیم، بەڵام لە راستیدا ئەو مەسافەیەی من لەگەڵ خاکی کورد و هەروەها ئەزموونی تایبەتی خۆم کە هەندێ جار نزیک و هەندێ جاریش دوور بووە، توانام پێدەبەخشن لەوەی کە شتێک بخەمە سەر ئەو بەرهەمە. پێموابوو ئەوانیش درکیان بەو مەودایە کردبوو کە من دەمتوانی پێشنیاری بکەم.... بۆیە بە هەموو تەوازوع و شانازییەکەوە، من دەنگی خۆم تێکەڵ بە دەنگی نەزەند و دلاوەر و قەرەنی دەکەم.

ماوەی دە ساڵە من پەیوەندیم لەگەڵ کوردستان هەیە. لەگەڵ هونەرمەندانی کورد زۆر چالاکیمان نوندووە، لە سەرووی هەموویانەوە دامەزراندنی رێکخراوی باڵندەباران. ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێکانم کوردن یا دۆستایەتیی زۆریان لەگەل ئەو بەشەی جیهان هەیە کە ناوی کوردستانە. من لە ئەیلولی 2004 دا بۆ یەکەم جار سەردانی هەولێرم کرد (لە ساڵی 1997 هەوڵم دا بێم بۆ کوردستان، بەڵام نەمتوانی سنور ببڕم!). هیوادارم بتوانم گەشتی دیکەی کوردستان بکەم و بەردەوام بم لە ئاڵوگۆڕیی هونەریی وەکو ئەوەی ئێستا دەیکەم. لە سەر ئاستێکی فراوانتر، هیوادارم هاوکاریی لەگەڵ مۆزەخانەی هونەریی هاوچەرخی سلێمانی (کە رێکخراوەکەی من بناغەی بۆ داناوە) هەروەها لەگەڵ مۆزەخانەی هەولێردا بکەم.

سوپاس بۆ نەزەند و دلاوەر و قەرەنی کە وایان لێکردم بەشداری لەو داهێنانەدا بکەم.

ئێدیت هێنری
لیل/ فەڕەنسا
تەمموزی 2005

# ڕەنگی خۆڵ

نەزەند بەگیخانی – دلاوەر قەرەداغی

هێڵکاری

قەرەنی جەمیل – ئیدیت هێنری

ناوی کتێب: ڕەنگی خۆڵ
شیعری: نەزەند بەگیخانی – دلاوەر قەرەداغی
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە:
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
سەرپەرشتیاری چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم ، هەولێر– ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٣٦٢)ی ساڵی ٢٠٠٥ی دراوەتێ

# قسەیەک کە دەبوو گوترابا!

(ڕەنگی خۆڵ) ئەزموونێکی شیعریی هاوبەشە بۆ گەڕانەوە بەرەو شار، لە ساتەوەختێکدا کە ڕووناکی و تاریکی، خێر و شەڕ، جەژن و پرسە، منداڵی و پیری، مەرگ و ژیانی تێدا یەکانگیری یەکدی دەبن. ئەم ئەزموونە گەڕانەوەی دوو موسافیرە تا بەردەم شوراکانی شار، ڕووانینی ئەوانە لە پەنجەرە ڕۆشنەکانی بەیانیانی شار و خۆکردنیانە بە خەڵوەتەکانیدا. ئەم ئەزموونە هەوڵدانە بۆ دواندنی ڕۆحی پاکیژەی شار لە عاشقانەترین نوێژ و لە خوێناویترین جەژنیدا.

(سیفری کورد... کتێبی جەژن) شیعرێک بوو کە چەند ڕۆژێک دوای کارەساتەکەی یەکی شوباتی ٢٠٠٤ نووسرا. دوای بڵاوبوونەوەی شیعرەکە، پێشنیارمان کرد گەر بکرێ ئەو ئەزموونە بکرێتە ئەزموونێکی هاوبەش و مەوداکانی قووڵتر بکرێن و لە ڕەهەندی ئەفسانەییی دیکەوە بپێچرێ و ڕەنگی نوێی تێدا هەڵگۆزرێت. دەتگوت سەد ساڵە یەکترمان نەبینیوە و عەوداڵ بووین لەو لەحزەی فیراقەدا بە باڵی شیعر بچینەوە حزووری شار. ئیدی لەو ساتەوە ناونیشانی قەسیدەکە بوو بە (ڕەنگی خۆڵ) و نزیکەی پازدە شازدە جار بە ئیمەیل هاموشۆی لە نێوانماندا کرد، هەر جارەو بەڕەنگ و ئیماژێکی جیاواز و بە وزەیەکی بەگوڕتری دەربڕینەوە دەگەڕایەوە. تا دوا جار لەسەر ئەم ڕەنگەی خۆڵ گیرسایەوە و ئەم قەسیدەیەی لێ لەدایک بوو.

لە ناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ڕابردوودا و بە ئامادەبوونی چەند هاوڕێیەکی هونەرمەند و ئەدەب دۆست، ڕەنگی خۆڵمان



لە کتێبخانەی کوردی لە ستۆکهۆڵم خوێندەوە. لە ڕاستیدا ئەو کاردانەوە و پەرۆشییەی کە دوای خوێندنەوەی قەسیدەکە لە ڕوخساری ئەو هاوڕێیانەدا بەدیمان کرد، خەنیی کردین و هانی داین (ڕەنگی خۆڵ) بەم شێوەیەی ئێستای لەم نامیلکەیەدا چاپ و بڵاو بکەینەوە.

لە یەکی شوباتی شاردا هەموومان گریاین. هەر یەکەمان بەشێوەیەک هەژاین و هەر یەکەمان بە تەرزێک بەرەو لای ڕۆحی پاکیژەی شار گەڕاینەوە.

لە ڕەنگی خۆڵدا شار دەبێتە ئێمە و ئێمەیش دەبین بە ڕۆحی شار. ڕۆحێکی ناسک و نیگەران، ڕۆحێکی ژاکاو لەژێر سەدای ئازارێکی نەرم و قووڵ وەکو ئەنفال و بێدەنگی کۆڵانەکانی هەڵەبجە. لەوێدا لەگەڵ مردووەکاندا هاوتا دەبین، چەشنی بەرد سڕ دەبین و چەشنی خۆڵ ڕادەچڵەکین. لەوێدا مەرگی شار مەرگی هەموومانە، لەوێدا هیچ شتێک داد نادا تەنیا وشە و ڕیتم نەبێ کە لە یەک کاتدا ڕۆشنمان دەکەنەوە و بەندیشمان دەکەن، ئینجا دەمانگوازنەوە بۆ ناو پانتاییی وەجد و نوور. لەوێدا دەبینە گەردیلەیەکی بەرز بەرز و دەپەڕینەوە بۆ ئەودیوی خۆڵ، دەگەڕێینەوە بۆ ئەمدیوی ژیان.

ڕەنگی خۆڵ، گەڕانەوەی تەنیاییەکانمانە، ئەمە نەوای ئەو شمشاڵە غەمگینەی ئێمەیە کە دەبوو لەو بەیانی وێران بوونەدا ژەنرابا!

**نەزەند بەگیخانی دلاوەر قەرەداغی**

شوباتی ٢٠٠٥

# کورتە پێشەکییەک*

## نەزەند بەگیخانی

ڕەنگی خۆڵ شیعرێکی هاوبەشی من (نەزەند بەگیخانی) و دلاوەر قەرەداغییە. زەمینەی ئەم شیعرە شاری هەولێر و جەژنی قوربان و کۆمەڵێ وێنەی خوێناوین کە سەرلەبەیانی ١ی شوباتی ڕابردوو ٢٠٠٤ لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانمانەوە هاتنە ناو ماڵەکانمان و حەقیقەتێکی تاڵی وەبیرهێنایینەوە: حەقیقەتی هەڕەشەی لێدان و قڕکردنی کورد. لەم ڕۆژەدا دوو هێرشی تیرۆریستی کرانە سەر شاری هەولێر. ئەم ڕووداوە و وێنە خوێناوییەکانی ناخی مرۆڤی کوردیان وروژاند. لە مەیانی کۆمەڵێ هەستی تێکەڵ بە هەڵچوون، تووڕەبوون، ترس و گریان و خۆخواردنەوە گنیگڵمان دەدا و ئاسان نەبوو بیرمان کۆبکەینەوە بەرەو ئاراستەیەکی شیعری. گەلاڵەی ئەم شیعرە لەم ماوەیەدا لەدایک بوو.

لەم ڕۆژەدا، من بەبێ ناونیشانێکی دیاریکراو کۆمەڵێک کۆپلەی شیعریم نووسی و لێی گەڕام بۆ تەواوکردن لە ئایندە. چەند ڕۆژێکی پێ چوو، لە لایەن دلاوەر قەرەداغییەوە شیعرێکم بە ئیمەیل پێگەیشت کە تایبەت بوو بە هەمان ڕووداو و هەمان وروژان. کە خوێندمەوە. شیعرەکە یەکسەر بۆخۆی بردمی و لەناویدا هەستم بەژەنین و ژان و ژیانێک کرد. هەستم بە جووڵە و پانتاییەک کرد بۆ ئاوێتەبوونی هەناسە شیعرییەکانی خۆم و دلاوەر. بۆیە یەکسەر ئیمەیلێکم بۆ دلاوەر نووسی و پێشنیاری ئەوەم کرد پانتاییەکە بکەینە ئەزموونێکی هاوبەش و لە شێواز و ڕیتم و سەدایەکی ئەفسانەییدا دایبڕێژینەوە. هەر لەو کاتەوە ئەم شیعرە لە نێوان



من و دلاوەر بە ئیمەیل لە سەفەردایە. لە هەر سەفەرێکیدا ڕەنگێکی دەگرت و بە هێما و جووڵەی نوێوە دەهاتەوە. ئێستا ئەم ئەزموونە شیعرییە هاوبەشە لەلای ئێمە تەواو بووە و لە سەفەردایە بەرەو خوێنەر. لە پشت هەر هەنگاوێکیدا سیمای شارێکی بریندار و مەینەتییەکی مەزن خۆیان حەشارداوە: شاری هەولێر و مەینەتییەکانی مرۆڤی کورد لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا.

من و دلاوەر قەرەداغی لە ساڵی ١٩٨٤ەوە یەکتری دەناسین. ماوەی ١٨ ساڵ بوو یەکتریمان نەبینیبوو، بەڵام پێوەندیمان هەرگیز نەپچڕا. ئەم شیعرە لە پانتاییەکی نەمر و ناوێزەدا کۆی کردووینەتەوە: پانتاییەکانی (ڕەنگی خۆڵ

---

* ئەم پێشەکییە هاوتا لەگەڵ ڕەنگی خۆڵ لە ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ١١/١٢/٢٠٠٤دا لە ستۆکهۆڵم خوێنراوەتەوە.

پێشکەشە بەو چاوانەی لە سەفەری جەژن بەجێمان

بە ئێوە... کە لە چاوەڕوانیی هەمیشەییی ئەوانەدا دەبن
کە خۆشتان ویستن

کە خۆشیان ویستن

بە تۆ... ئەی تەنیاترین شار!





قەرەنی جەمیل

کە دێیت شارێک دێتە سەر ڕێگات. لە هەرچوار لاوە (با)یەک
بەسەرتا هەڵدەکات،

بایەک لە خۆرهەڵاتەوە، بایەک لە خۆرئاواوە، بایەک لە باشوورەوە و
بایەک

لە باکور

لەوێدا خۆت دەتەکێنیت و ئاوێنە چکۆڵەکەی گیرفانت دەردەهێنیت و
لە خۆت

دەنۆڕیت

هێشتا هەر لەبەر دەروازەی شاردا ڕاوەستاویت و لە ئاوێنەکەدا
دەبینیت:

دەبینیت سەراپا تەنیایی خواردوویتیت،



دەبینیت:

سەراپا جەستەت شەلاڵە لە خوێنێکی پەمەیی

لە خوێنێکی ڕەنگاوڕەنگ

لەوێدا دەست ڕایەڵ دەکەیت

وەک بڵێی بتەوێ بفڕیت،

باڵ ڕادەوەشێنیت و

چتاقیان بەرەکەت دەدەیت.

ئەوەی کە ڕوو دەدات

نە سەرەتایە و نە کۆتایی

سەفەرێکی ئێستایە

لەناو سوڕی زەمەن

## عەهدی نوێ – سیفری کورد

## سەفەری جەژن

## کتێبی یەکەم





ئێدیت هێنری

لە گۆشەیەکی شەودا ئەستێرەیەک ڕژا

شار لە شیرینە خەوندا وروژا

منداڵێک لە پەنجەرەوە دەیڕوانی

شار غەرقی نوور بوو

نووری جەژن

نووری قوربانی

نووری ئیسماعیل

نووری ئیمان





قەرەنی جەمیل

شار دیارە

شار لە خەو ڕابوو

شار چاوانی هەڵدەگڵۆفێ و

لەسەر کانیی سپێدە خۆی لە ڕەنگ هەڵدەکێشێ

شاڵێکی سپی بەسەر شانەکانیدا دەدا

شادە و ئیمانێ دەهێنێ

شار بە خەمە ڕدێن سپییەکانیەوە بۆ سەفەر دەچێ

شار کوژراوەکانی بۆ پیاسە دەبا

شار دەکەوێتە سەما

سەمای جەژن

سەمای حەیرانبوون

سەمای دیارنەمان

سەمای پەمەییترین یەقین

سەمای شێتبوون

سەمای یەکەمین ساڵی سەفەر





ئێدیت هێنری

شار دیارە

شار بە کێڵگە گەنمییەکانیەوە زیکر دەکات

بە گوڵە حاجیلەکانیەوە حاڵ دەگرێت

بە هەنارەکانیەوە دەتریقێتەوە

شار بە ئاوێنەوە لە نوێژ دێتەوە... مەولا

شار بەو بەیانییە زووە

قەرەباڵغە وەک پوورەیەک حیکایەت

بێپایانە وەک دەشتاییە نارنجییەکان

دەدرەوشێتەوە وەک ئاهەنگی جەژنەکان





قەرەنی جەمیل

شار بەو بەیانییە زووە
لەبەر شەپۆلی میوان
تا ئەژنۆ خۆی هەڵکردووە
پێ دەکەنێ... شاری میهرەبان
ستران دەچڕێ... شاری پیر
دەستەکانی لە کەمەری با و
باڵای لەنێو ئەستێرکێک نوور
شار دیارە... مەولا
شارە پڕ لە ئیسماعیلەکەی خۆت
شارە پڕ لە تەیرەن ئەبابیلەکانی خۆت!
شار دیارە... مەولا
شارە زۆر دوورەکەی خۆت!
ژنێک هات و بەدەوری شاردا سووڕایەوە
ئینجا دەستنوێژی هەڵگرت و
ڕووی کردە دەروازەی گۆڕستان



ئێدیت هێنری

ئەو لەوێ دانیشت و

حیکمەتی بەردی ڕاڤە دەکرد و

لە سکونی ئەو کێلانە ڕادەما

کە سووڕی ژیانیان تێدا نوستووە

لەو دێرانە ڕادەما

کە خوێنی وشەیان تێدا مەییوە

وشەیەک لەو قسانەی کە هەرگیز نەگوتران

یەکەمین پیت لە سەرەتای نامەیەکی نەنێردراودا

یەکەمین پەیڤی دۆشداماو لەبەر دەرگای عەشق

دۆشداماو لەبەر پەنجەرەی چیرۆکێکی نەنووسراودا

یەکەمین پیت لە یەکەمین سپێدەی زمان پژاندا





قەرەنی جەمیل

دەرگایەک دەکرێتەوە لەسەر ئەودیوی دونیا

خەیاڵێک دێتە گۆ

ڕێگایەک ڕادەکشێ

لەژێر تەنی یەکەمین هەنگاوی ساوایەک

ڕێگایەک بەرەو ئێرە

ڕێگایەک بەرەو ئەوێ

ڕێگایەک بەرەو ئەو شوێنەی کە هەرگیز لێی نابیت

پانتاییەک لەناو جەژنێ

لە کەنار شارێکی دەرەوشاوە

جەژنی پێکگەیشتن و

جەژنی لێژبوونەوە بەرەو ئەودیوی شتەکان

بەرەو ئەودیوی با و ئەستێرەکان





ئێدیت هێنری

ئەودیوی پانتاییە نارنجییەکان

منداڵێک لە پەنجەرەوە دەیڕوانی

ئەستێرەیەک ڕژا

شار غەرقی نوور بوو

نووری ئیمان

نووری قوربان

نووری شینی ئاخری زەمان





قەرەنی جەمیل

شار دیارە... مەولا

شارە دڵ ئێشاوەکەی خۆت

شارە عاشقەکەی خۆت

شارێک کە ئەگەر ڕۆژێک ئەسپەکانت دیار نەمان

ئەوا بزانە چتاقیان بە تاسەی ئەوێوە فڕیون و

هەنووکە هەر هەموویان لەوێن

شارێک کە ئەگەر ڕۆژێک پەپوولەکانت

سەری خۆیان هەڵگرت

ئەوا دڵنیابە مەولا... چتاقیان

لە باخچەکانی ئەوێن

لەوێ پەپوولەیەک لەناو ڕۆشناییدا سەما دەکات

گوڵێک گۆرانی دەڵێت

تاڵە گیاکان دەنگی من و تۆ نەخش دەکەن





ئێدیت هێنری

کۆترە باریکەکان سەرگوزەشتەی عەشقێکی بەسەرچوو دەنووسنەوە
عەشقی ئێمە
عەشقێک هەر هەمووی لە نوور

فڵچە بەسەر ڕوخساری هەوادا دەهێنم
دیمەنێ نەخش دەبێ
دیمەنی لم لە جووڵەی هەمیشەییدا
دیمەنی شەپۆل لە هەڵسانی سپیدا
دیمەنی فڕین لە قووڵایی شینیدا
دیمەنی ئەوین لە بەرایی بارینادا
دیمەنی شارێک لەناو نووری ئەبەدیدا
دیمەنی من و تۆ لە پانتاییی نادیاریدا





قەرەنی جەمیل

منداڵێک لە پەنجەرەوە دەڕوانێ

ئەستێرەیەک ڕژا

دەڵێن پادشایەک کۆچ دەکات

زارۆکێکی کاکۆڵ زێڕین لە دایک دەبێ

زینێک خۆی لە خم هەڵدەکێشێ

مەمێک درەنگ وەختانێک دێتەوە

هەموو شتێک لێرەوە کۆتاییی پێ دێت

هەموو شتێک لێرەوە دەست پێ دەکات

شار دیارە... شار... مەولا شارەکەی خۆت

شارێک هەمیشە ڕاوەستاو

شارێک بەرماڵەکانی دوعا





ئێدیت هێنری

شارێک هەمیشە ڕاماو لەودیو پەرژینەکانی بەهەشتەوە

شارێک هەمیشە دانیشتوو بە بەیازێکەوە

لەسەر سەکۆکانی ئینتیزار

شارێک هەمیشە بە ئاسمانەوە لەسەر بەرماڵێکی باڵدار

شارێک هەمیشە دەم بە حیکایەت

شارێک هەمیشە قەفەسەکانی پڕ لە خەیاڵ

شارێک هەمیشە جانتاکانی پڕ لە ڕەنگ

فرمێسکەکانی پڕ لە مەرجان

ئینجا تۆ دێیت و دەبینیت

قەدەرت لەسەر بەردێکی ئەو شارە هەڵکەنراوە!





قەرەنی جەمیل

ئەو تەرمەی کە دێتە ڕێت
تەرمی دوا پادشای شارە
ئەو نوورەی بەسەرتا دەبارێ
نووری ئەستێرەیەکی ڕژاوە
ئەو باڵندەیەش کە لەسەر سەرت هەڵدەفڕێ
ڕۆحی کۆشکێکی وێرانە
ئەوەی کە لە تەکتدا ڕێ دەکات
سێبەری خۆت نییە
ئەوە ڕۆحانییەتی پیاوێکە
کە لە ئەسانەوە دێتەوە
لە ماڵی خوڵەوە
لە ژوورەکانی نەگوتن
سەڵەوات لەو ڕۆژەی کە تێیدا هاتییە دونیاوە
ڕۆژێکیش بۆ ژیان





ئێدیت هێنری

ڕۆژەکانی دیکەش بۆ چوون بەرەو مەزاری نادیاری

شار دیارە... شار خۆی دەشوات بەو بەیانییە

شار لەسەر کانیی جەژن

دەستنوێژ هەڵدەگرێ و

گوڵاوێکی ڕێحانی لە خۆی دەدات

شار لەبەرخۆیەوە گۆرانی دەچڕێ

مەولا

گۆرانییەکی دوور... هەی لێ لێ... هەی لۆلۆیەکی شین

گۆرانییەک هی زەمەنە دێرینەکان

گۆرانییەک هی زەمەنەکانی سکووت

گۆرانییەک هی زەمەنی گەڕانەوەی ئەسپە باڵدارەکان

گۆرانییەک هی زەمەنی فیغان!





قەرەنی جەمیل

فڵچە بەسەر ڕوخساری خۆڵدا دەهێنم

دێمەنێ نەخش دەبێ

دیمەنێکی ئەفسانەیی کە بۆ ئەبەد دەمێنێتەوە

(حەزرەتی ئیبراهیم دەستی زارۆکێکی گرت و

نشێو بووەوە بۆ ناو نزرگای عیبادەت

ئەی حەزرەتی ئیبراهیم

ئەو بەرخە سەرپشت خەنەییە بۆ کوێ دەبەی؟

لەو دەشتە تەنیایانە!

هیچ خودایەک نایەتە گۆ

هیچ دەستێک قوربانی ناخاتە بەر پێت

ئەی حەزرەتی ئیبراهیم

چاوەکانمان پڕ بوون لە نزا

دڵمان سیخناخە بە تەنیایی

دەستەکانمان غەرقی پاڕانەوەن!)





ئێدیت هێنری

به دواتدا دەگەڕێم مەولا

بەدوای شارێکی ماتەمین

بەدوای نهێنییەک کە ئیتر کەس نایدرکێنێ

بەدوای خوداحافیزییەک کە بەپەلە کردمان

بەدوای گلەییەکدا کە نەماندرکاند

بەدواتدا دەگەڕێم

بەدوای چاوە وەریوەکانتا

بەدوای مۆسیقای پەنجەکانتا

بەدوای منداڵیی ئەو شارە و

سەرمەدیی ساڵەکانتا

بە دواتا دەگەڕێم مەولا

من دەگەڕێم بە دواتا!





قەرەنی جەمیل

لە گەڕان بەدوای تۆدا

من خۆم دۆزییەوە مەولا

ئەوەتا لەبەر هەیوانی سپەهی ڕاوەستاوم

سەرم درەختی وشە و

جەستەم گەرم لە بۆشایی

من سەما دەکەم مەولا

سەمای جەژن

سەمای سەفەر

سەمای شینی ئاوابوون!

شار دیارە

شار... لێو دەکرۆژێ شار





ئێدیت هێنری

شار پێ دەنێ بە جەرگی خۆیدا

شار بە پەنجەی قرتاوەوە دەچێت بۆ میوانداری

شار لە دڵەوە دەیەوێ بگری

کەچی شار

عیزەتی نەفسی شاربوونی

ڕێگای نادا

مەولا... گوێ ڕادێرە

شار خوڕ خوڕ دەگری و

ژنێک لەژێر دار زەیتونێک

حیکمەتی بەرد دەخوێنێتەوە





قەرەنی جەمیل

فاتیحا... ئەلفاتیحا

سەلامتان لێ بێ ئەی مەحشەری غەرقبوو

لەناو بێدەنگی

سەلامتان لێ بێ

ئەی ئەوانەی سەرەتاتان خۆڵ بوو

عاقیبەتتان هەر خۆڵ

لێم قبووڵ کەن ئەو چڵە تریفەیە

ئەو هێشووە سەردولکەیە

تەدارەک و موبارەک

سەفەری جەژنتان موبارەک

ژنێکی ئەسحابەیی لەژێر دار زەیتونێک

شکۆمەندانە حیکمەتی بەردیی دەخوێندەوە

فرمێسکەکانی کریستاڵی بوون

لەناویاندا

شارێکی تەنیا خۆی حەشار دابوو

شارێکی پڕ ئوبەهەت!

منداڵێک لە پەنجەرەوە دەڕوانێ

ئەستێرەیەک ڕژا





ئێدیت هێنری



قەرەنی جەمیل



شینەشاهۆیەک هەڵفڕی و سێ جار بەدەوری شاردا سووڕایەوە

سێ جار تەماشای کردین

سێ جاریش ئاماژەی بۆ کردین

ئینجا هات و لەسەر شانی شار نیشتەوە

شاری دەشتاییە زەردەکان

شاری زەمەنە دێرینەکان

شاری منداڵییە بابردووەکان

ئینجا تۆ هاتیت و

گۆچانی ئەفسوناویت ڕاوەشاند

بەرد ڕاچڵەکی و

ڕۆحمان دایە شەقەی باڵ و ئاوابوو... مەولا

له سبەینێ زووتر نییه

شار دەبێتەوە عاشق

شەر دەکەوێتە نووسینەوەی جووڵە و هێماکانی

دەکەوێتە نووسینەوەی پانتایی و هێڵەکانی

دەکەوێتە نووسینەوەی بیابان و

لاواندنەوەی دەنکە خۆڵەکانی

له سبەینێ زووتر نییه

شار دەبێتەوە عاشق

شار دەبێتە غەمگینترین شمشاڵژەن

دەکەوێتە ژەنینی بایەکانی

دەکەوێتە ژەنینی حەیرانەکانی

دەکەوێتە پاکنووسکردنی عومری خۆی





ئێدیت هێنری

بڕوانە مەولا

شار بووەتە چ عاشق و چ شمشاڵژەنێکی مەلوول!

مەولا بڕوانە... شار بووەتە مەلوولترین هێمای ئێمە!

ئەی هەمیشە مەلوولێک لە سارای ئێمەدا

ئەی هەمیشە دڵێکی شکاو لە سینگی ئێمەدا

ئەی هەمیشە قسەیەکی نەگوتراو لە زاری ئێمەدا

ئێمە شەکەت بووین لە نامە نووسین

ئێمە شەکەت بووین لە سەفەر

ئێمە شەکەت بووین

لە بینینی شارەکان

لە پەڕینەوەی زەریاکان

لە سەرکەوتن و هاتنە خوارەوەی پەیژەکان

ئەی هەمیشە سەربڕاوێک لە ئێمەدا

بمانبەرەوە ماڵە دوورەکەی خۆت

بمانبەرەوە شارە ساواکەی خۆت

بمانبەرەوە بەر هەیوانە کەسکەکانت

ناو ژوورە سپیەکانت

بمانبەرەوە سەر سەکۆی قەناعەت





قەرەنی جەمیل

مەولا... گوێ ڕادێرە

شار خوڕ خوڕ

لەناوەوەیڕا وروژاوە بە گریان

وروژاوە بە ژان

مەولا گوێ ڕادێرە... شار خوڕ خوڕ

بەدەم ئاودانی ئینجانەکانیەوە دەگری

بەدەم خۆراکدانی کۆترەکانیەوە دەگری

بەدەم داپۆشینی منداڵەکانیەوە دەگری

بەدەم سڵاوکردن لە هاوسێ قەڵەو و میهرەبانەکانیەوە

بەدەم لێ کردنەوەی بۆڵێک ترێ لە مێوەکەیەوە

بەدەم جوڵاندنی ئاریالی تەلەفزیۆنەکەیەوە

بەدەم کڕینی قوتوویەک چوکلێتەوە

بەدەم پێچانەوەی سیگارێکەوە

بەدەم هەڵگرتنەوەی گوڵە یەخەیەکەوە

بەدەم نووسینی نامە دڵدارییەکانیەوە

بەدەم پیاسەی ئێوارانیەوە لەگەڵ هاوڕێ شاعیرە بۆهیمییەکانیدا

بەدەم عاشق بوونە ناکاوەکانیەوە





ئێدیت هێنری

بەدەم دانیشتنی نێو چاخانەکانیەوە
بەدەم میقاتکردنی کاتژمێرەکەی بەرباخەڵیەوە
بەدەم خواردنی نوقڵەکانی جەژنیەوە
بەدەم کتوپڕ بڕیاردانی سەفەر و
دیارنەمانە منداڵانەکانیەوە
شار خوڕ خوڕ لە ناوەوەیڕا وروژاوە بەگریان

شار شاڵێکی سپیی لەسەر شانە و
بە گۆچانێکی پڕ نوورەوە
سەفەر دەکات
سەفەری جەژن
سەفەری کۆچێکی دیکە
سەفەری ئەبەدیی دیارنەمان
زۆر کەس بەو دەشتانەدا تێ پەڕین
باڵایان پڕ لە قوربانی و
دەستەکانیان میهرەبان
گوڵەگەنمە وەنەوشەییەکانیش
سەرگوزەشتەی ئەو بایە دەنووسنەوە





قەرەنی جەمیل

حیکایەتی شارێکی سپی

سپی وەک نیشتنەوەی لەقلەق

سپی وەک سەفەری زستانی عەقدی سێیەم

سپی وەک عەشق لە زەمەنە دوورەکاندا

چڵێ غوبار

بەسەر دەروازەی ئەم شارەدا چەماوەتەوە

منارەی فیغان

لەناو چاوانتاندا هەڵچووە

قەڵایەکی ڕەشبەڵەک

لەسەر سنگتان نەخش بووە

هەمووتان پێکەوەن لەم گەشتەدا

گەشتی گەیشتنە ئێرە و

گەشتی دوایین سەفەر

سەفەری جەژن

سەفەری عەقدی سێیەم!



ئێدیت هێنری

شار دیاره مەولا

شار... بەردەوام دەگری شار

شار منداڵترە لە جاران

پیرترە لە سبەینێی ڕۆژەکان

شار بەدەمی پڕ لە نوقڵەوە دەگری

شار بە پۆشاکی نوێی جەژنەوە دەگری

شار بە پێڵاوە تازەکانیەوە دەگری

شار وێنەیەک لە پاڵ ئەسپە دارینەیەکی جێژندا

بۆ یادگار دەگرێ و دەگری

شار سواری جۆلانە دەبێ و دەگری

شار تەوقە لەگەڵ کەسدا ناکات

شار... هەرتک دەستی لە گیرفانیدایە و دەگری

شار لە کاتی بینینی فیلمەکانی دیزنیلاندا دەگری

شار بەلای دەرابەی داخراوی دوکانەکاندا

تێ دەپەڕێ و دەگری

شار بەدەم خەوەوە دەگری

مەولا... گوێ ڕادێرە

شار دەگری!





ئێدیت هێنری

لەوێ

لەودیوی گشت هیواکان

لەودیوی با و سێبەرەکان

لەودیوی ڕاکردنە بەتینەکان

شارێک دیارە

جەستەی دەشتاییەکی شینە

پانتاییەک بۆ ئارامی و

قوربانییەکی مەزن

ترووسکاییەک لەو نیگایەی کە دەکرێتەوە

بۆ سەرزەمینێکی سوور

سەرزەمینی جەژن

سەرزەمینی شینی شار

شار دەگری و

ئەسپەکانی نیشتمانی لێ کۆدەبنەوە

باڵندەکانی بەسەردا دەبارن





قەرەنی جەمیل

چەشنی بارانی چوارەمین وەرز
وەرزی پێکەنینە گەرمەکان
وەرزی عەشقە نەمرەکان
وەرزی سەفەرە مەزنەکان
وەرزی پێکەوەیی و دوورییەکان
وەرزی گەڕانەوە لە نادیاری و
ئاشتبوونەوە بە سیماکان
وەرزی یەکەمین بینینەوە دوای زەمەنی مەنفاکان
وەرزی سەفەر
وەرزی خوێن
وەرزی ژوانێکی گەرم لەگەڵ گەرد و خۆڵ و بەرد
وەرزی سەفەری عەقدی سێیەم
سەفەری جەژن
وەرزی سیفری ئێمە
وەرزی ژاکانی پەنجەکانی من و تۆ!





قەرەنی جەمیل

شار دێت... مەولا

شار بە تەنیاییەکانیەوە دێ

شار بە شاڵێکی سپی و

خەیاڵەکانیەوە دێ کە پڕن لە مەرجان

شار بە ئەفسانەکانیەوە دێ

کە هەر هەمووی لە کانزای بان

شنەیەک بەناو گوڵەگەنمەکاندا هەڵدەکات

بێدەنگی درز دەبات

هێمنی سەیرمان دەکات

شار بەدەم خەونەکانیەوە دێ

کە ئاورینگ دەدەنەوە بە ژیان

شار دێ مەولا

شار بە حاجی لەقلەقە حەکیمەکانیەوە دێ

بە حەیرانبێژە دێرینەکانیەوە

شار بە خەڵوەتەکانیەوە دێ و بە شەهیدەکانیەوە

بەو ژن و پیاوە ونبووانەیەوە دێ

کە هەزاران ساڵە بەرەهووتەکانیان لە دوو دەگەڕێ





ئێدیت هێنری

با پێمان بە هێواشی دانێین لەسەر ئەو خاکە مەولا

نەوەک خۆڵ ڕاچڵەکێ

با نەیگرێ ئازار ڕۆحی ناسکی شار

بڕوانە شار... بەو درەختە ئاگرانەیەوە دەسووتێت

بەو ئازارە سپیانەیەوە سەفەر دەکات

سەفەری جەژن

سووتانی ئەبەدیی ڕۆحمان

ڕۆحی من و تۆ

ڕۆحی سەرگەردانی شار!





قەرەنی جەمیل

ئەم خۆڵە ڕۆحی من و تۆیە مەولا
ڕۆحی شارێکی حەیران
دواتر کە لەشمان دەڕوێ
با – گوێمان لێ دەگرێ
با – ئازارەکانمان دەژەنێ
با – خەونەکانمان دەلاوێنێتەوە
خۆڵ لەناو خۆیمان دەڕوێنێ
ئەو ئاوە کریستاڵییەش
دەمانباتەوە سەر کانیی ئەستێرەکان
دەمانباتەوە لای وێنە ڕەش و سپییەکانی خۆمان
دەمانباتەوە ڕۆژهەڵات
لای پەیامەکانی خوا
دەمانباتەوە سەر گردە نارنجییەکانی منداڵی
لای یەکەمین نوتفە
لای یەکەمین قسە
لای نهێنی
دەمانباتەوە ناو بێدەنگیی دایک و
باوەشی خۆزگەکان
دەمانباتەوە لای یەکەمین گەمە و
لای یەکەمین سەفەر
سەفەری جەژن و پێکەنین
سەفەری وێرانبوون





قەرەنی جەمیل

ئەستێرەیەک ڕژا و
منداڵێک لە پەنجەرەوە دەیڕوانی
ڕووانینێک وەکو ئەوەی بۆ ئەبەد بمێنێتەوە
شار غەرقی نووربوو
چاومان لە سەفەر و
دەستەکانمان پڕ لە نزا

غەجەرێکی بەختگرەوە دەستەکانمی گرت و
هێڵەکانی شی کردەوە
ئەو پێی وتم تۆ کۆچ دەکەیت
کۆچێکی دوور
زۆر دوور
کۆچێکی شین
بۆ ئەوبەری شەپۆلەکان
کۆچێکی سپی
بۆ ناو فەزای فڕینەکان
کۆچێکی سوور
بۆ ئەوبەری ئومێد و
ناو کۆشی کەوتنەکان
ئینجا من کەوتم و
لەوەتای لەوێ ئاودیو بووم
بەدوای هێڵەکانی خۆم و
ڕەنگەکانی بوون و
هەڵسانەوەدا دەگەڕێم





ئێدیت هێنری

غەجەرێکی بەختگرەوە دەستەکانمی گرت و

ڕەنگەکانی ڕوانینمی خوێندەوە

گوتی: تۆ ڕۆژێک لەوێوە دێیتەوە

تەنیا و نامۆ و ڕەنگاوڕەنگ

لە دارستانەکان دێیتە دەرێ

سەرت دەبێتە ڕەهێڵە و

لەشت بەفرێکی نەرم

پێی گوتم: تۆ ڕۆژێک دەچیتە ئەوێندەر

بە زوبانی باران دەدوێیت

بە پەنجەی خۆڵ نیگامان ڕەنگ دەکەیت

ڕوخسارت شین دەچێتەوە بەئاونگ

تۆ ئێوارەیەک دەچیتەوە ئەوێندەر

پاش عەسرانێک دەبیتە با و هەڵدەکەیت

تۆ بەیانییەک چەشنی ڕەنگ دەژاکێیت





قەرەنی جەمیل


ئێدیت هێنری



مەولا... ژوورێک لە ماڵەکەت بۆ شار دانێ
بانیژەیەک لە بەهەشت
جێگایەکی بۆ دابنێ
لە نزیکی خۆت
من لەو دونیا دێمەوە
سەبەتێ ڕێحانەم هەڵگرتووە لەگەڵ چڵێ زەیتوون
بۆ ژێر سەرینی شار
ناو ژووری چەسپاوی لم
من لە پشت ئەو پەردانەوە شار دەبینم
کە لە گەردی فرمێسکەکانمان دروست بووە
کە پڕە لە تەنیاییەکانی ئێمە
شارێ کە لە نێو دڵی زەردی خۆڵستانەوە
دێتە سە گۆنای ئاڵی فڕین
شارێک کە مەوج دەداتەوە بە سەربڕین
شارێ کە دەبێت بە«فلووتێکی ئەفسووناوی»[١] و
دەگات بە بەرزاییەکانی گوتن

(١) ئاماژەیە بۆ سیمفۆنیای فلووتی ئەفسووناویی مۆزارت.

مەولا وا شار دێ

جێگایەکی بۆ دابنێ کە بڕوانێ بەسەر حەوشەکەتا

بڕوانێ بەسەر چیمەنەکانتا

بڕوانێ بەسەر هێلانەی کۆترەکانتا

بڕوانێ بەسەر منداڵیتا

بڕوانێ بەسەر خوێندنی کەنارییەکانتا

جێگایەک بۆ شار دانێ مەولا

جێگایەک دوور لە دەر و دراوسێ بەخیلەکانی

دوور لە دوژمنە هارەکانی

دوور لەو سیحربازانەی لەوەتی هەن

جادووی ڕەشی لێ دەکەن

دوور لەو بازرگانانەی لەوەتی هەن

شتی بەگران پێ دەفرۆشن

فێڵی لێ دەکەن





قەرەنی جەمیل

دوعای خراپی بەسەردا دەخوێنن

حیکایەتەکانی دەبەن

مووروووەکانی دەفڕێنن

وەهمەکانی لێ دەستێنن

کاتێ دەچێ بۆ سەفەر

کاتێ دەچێ شتێکی تازە بکڕێ

هەر هەموو سەر دەکەن بەیەکدا و

حەسوودیی پێ دەبەن

ئینجا با ڕاکشێین مەولا

با چاوانمان لێک نێین و

گوێ بۆ حیکایەتی شار ڕادێرین

با لە شینایی ئاسمان

بەلەمێک دروست کەین

تا وشەکانمان بە ئازادی سەفەر کەن

سەفەری جەژن

سەفەری زستانی عەقدی سێیەم

سەفەری ئەستێرە ڕژاوەکان

سەفەری قوربانی

سەفەری ئیسماعیل

سەفەری ئیمان





ئێدیت هێنری

شار دێ... مەولا

مەولا... شار دێ

جێگایەکی بۆ دابنێ لە نزیک خۆت

جێگایەک لە تەنیشت خەونێکی خۆت

کورسییەک لە بەرامبەر کورسییەکەی خۆت

جێگایەکی بۆ دابنێ

لە حەوشەی دواوەی بەهەشت

کورسییەکی بۆ دابنێ لە چیمەنەکە

ڕێک... مەولا بەرامبەر خۆت

ئینجا بەرد دێتە گۆ

بەرد بە زمانێکی نەرم سەرگوزەشتەی شار دەنووسێتەوە

بەرد لەسەر بەرد

بەرد لە تەنیشت بەرد

بەرد لەناو بەرد

بەرد دراوسێی بەرد

بەرد دوژمنی بەرد



جەستەکانمان ڕاکشاون

مۆسیقای شار دێتە گوێ

مۆسیقای دەستەکانمان

لەسەر ڕووی ژیان

هەموو ئەوانەی کە خۆشمان ویستن

هەموو ئەوانەی کە خۆشیان ویستین

هەناسەمان لەناو جەستەی خۆڵدا ڕەنگ دەگرێ مەولا

بەبێدەنگی دەچینەوە ئەوێندەر

بێدەنگ دەبینە خۆڵ!



ئێدیت هێنری



شوێنەکان هەموویان پێک دەچن

هەموومان پێکەوەین لەم گەشتەدا

ئەمە دوا وشەی

دوایەمین ڕێبوار بوو

نەوەی کۆنترین هۆزی دونیا

لە دوایەمین شاری سەرزەمین

لە منداڵترین نەسلی بەرد

بزێوترین زارۆکی بەفر!

هەموومان پێکەوەین لەم ئاوابوونەدا

پێکەوەین کە دەبینەوە خۆڵ

بایەک بەسەر ڕووخسارماندا هەڵدەکات

ئنجا من و تۆ هەڵدەسینەوە

لە دوایین شاری سەرزەمیندا

لەودیوی زەمەنەکان

ڕادەوەستین

لەگەڵ یەکەمین چاوکردنەوەدا

ڕووخساری خوا دەبینین!

سوید – فەرەنسا

ساڵی ٢٠٠٤